


**حکومەتی هەرێمی کوردستان**

**وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی**

**زانکۆی صەلاحددین- هەولێر**

# بابەت

# [پەروەردە]

***ئامادەکردنی :- محمد زیرو کریم***

***بەسەرپەرشتی :- پ. د. عبد الحمید***

# ناوەرۆک


| بابەت | لاپەرە |
| --- | --- |
| پێشەکی | ٣ |
| پەروەردە | ٤ |
| چەمکی پەروەردە | ٤ |
| ئامانجەکانی فەلسەفەی پەروەردە | ٦ |
| بیروڕای "ئە فلاتوون لەسەر پەروەردە: | ٧ |
| مێژووی پەروەردە | ٨ |
| کۆتایی | ١٠ |
| سەرچاوە | ١١ |

# پێشەکی

لە مێژووی دووری کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییەوە تاکوو ئێستا، پەروەردە مەڵبەند و ناوەندی پێگەیاندنی مرۆڤەکان بووە. لە شارستانییەتە دێرینەکانی بابلی و میسری و یۆنانی و ڕۆمانی و فارسیدا پەروەردە وەك چالاکییەکی گرنگ بوونی هەبووە و، پێیان وا بووە پەروەردە گەورەترین شۆڕشی بەردەوامی مرۆڤایەتییە. لەگەڵ گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵگەکاندا پەروەردەیش گۆڕاوە و میکانیزم و ئامانجەکانیشی بەردەوام دەگۆڕێت. لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا مەبەستی پەروەردە دروستکردنی مرۆڤە لە باشترین شێوەدا و، ئەرکی پێگەیاندنی مرۆڤە بە ئاکاری بەرز، بەرپرسیارێتیی کۆمەڵایەتی، زانستی قووڵ و هۆشیاریی گشتی. پەروەردە وەك دەزگەیەکی کۆمەڵایەتی، بە دەزگە کۆمەڵایەتییەکانی تر دەبەسترێتەوە، ئاڵوگۆڕ و کارلێك دەکات لەگەڵیان و، هێزە مرۆییە هەمەچەشنەکان دەبەخشێتە کۆی کۆمەڵگە و دامودەزگەکانی ناویشی. ڕژێم و دەزگەکانی کۆمەڵگەیش پێداویستییە ڕۆشنبیری و کەلتووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکان بە پەروەردە دەبەخشن. واتە پەروەردە بە جیاوازیی بارودۆخی مێژوویی و شارستانیی هەر کۆمەڵگەیەك جیاوازە؛ بۆیە دید و تێڕوانینی جیاواز بۆ پەروەردە هەیە و، زۆر قوتابخانە و لێکدانەوە بۆ فەلسەفەی پەروەردە و کاری پەروەردەیی، بوونیان هەیە. ئێمە دەمانەوێت لە چوارچێوەی ئەم وتارەدا تیشك بخەینە سەر پێنا چەمکی پەروەردە، مێژووی پەروەردە،

## پەروەردە

بیرمەندانی بواری پەروەردە پێناسەی جیاوازیان لەسەر پەروەردە هەیە،ئەم جیاوازیانەش پەیوەندی بە دەورو نەقشی پەروەردەوە هەیە لە ژیانی تاک و کۆمەڵدا. هەندێکیان پەروەردە بە پرۆسەیەک دەزانن کە گۆڕان لە هزرو بیرو رەفتاری تاکدا دروست دەکات و بەشێکیان وەک دامەزراوەیەکی جڤاکی لەبەرچاوی دەگرن و کاریگەری دوولایەنەی نێوان مامۆستاو قوتابی لە قوتابخانەدا بە کاکڵەی باسەکانیان دادەنێن.

**"ژان ژاک رۆسۆ"** پەروەردە بە کەشتییەک دەشوبهێنێت کە دەتوانێت مرۆڤ لە زریان رزگار بکات. ئەو پێی وایە پەروەردە، بنەڕەت وژێرخانێکە کە دەکرێت سەرخانی کۆمەڵگایەکی تەندروستی لەسەر دروست بکەیت.

**"لێستەفۆرد"** ی کۆمەڵناس، پەروەردە بە کەرەستەیەک بۆ گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵگا ناودەبات و پێی وایە کە ئەنجامی ئەو گۆڕان و پێشکەوتنە ژیان باشی و خۆشبەختی تاکی لێ دەکەوێتەوە.

هەرچۆن بێت سیستەمی پەروەردە لە سەردەمی جیهانی بوون و تەکنەلۆجیاشدا دەوری بێ رکابەری خۆی لە پەروەردەکردنی مرۆڤدا پاراستووە، دامەزراوەی پەروەردە مرۆڤ بۆ داهاتوو پەروەردە دەکات، هەربۆیە دەبێت دیدو بەرچاوروونی باشی لە دوارۆژو پێداویستی کۆمەڵگاهەبێت. ئەزموونی وڵاتانی پیشکەوتووی وەک ئەمریکاو ژاپۆن ئەوە نیشان دەدات کە گۆڕان و پێداچوونەوەی بەردەوام بە پێکهاتەو پرۆگرامی پەروەردەدا دەبێتە هۆی پێشکەوتن لە بوارەکانی ئابووری، سیاسی، جڤاکی، کەلتووری و...دا.

## چەمکی پەروەردە

پەروەردە پرۆسەیەکی دێرین و فرەڕەهەندە و، سیستەمێکی گشتگیر و فراوان و بەردەوامە و، کارێکی مەودادوور و ئاڵۆز و بەیەکداچووە؛ دوورە لە هەر هەڵسەنگاندن و تێڕوانینێکی سادە و سەرپێیانە. پەروەردە یەکێکە لە میکانیزمەکانی مانەوە و بەردەوامیی کەلتوور و زانیاری و شارستانییەت، لە ڕێگەی گواستنەوەی کۆی فیکر و مەعریفە و کەلتوور بۆ نەوەی داهاتوو.

پەروەردە کلیلی دەستپێکی ژیان و بەردەوامیی گوزەران و ژیاری مرۆڤایەتییە. پەروەردە بۆتە زانستێکی سەربەخۆ و، لە ئێستادا بە پێوەری ژیار و ئاستی گەشە و پێشکەوتنی گەلانیش دادەنرێت. هیچ نەتەوەیەك یان کۆمەڵگەیەك ناتوانێت لەگەڵ کاروانی شارستانیی جیهان ڕەوت بکات و درێژە بە مانەوەی خۆی بدات، ئەگەر خاوەنی پەروەردەیەکی تۆکمە و پێشکەوتوو و دیموکراتییانە نەبێت.

پەروەردە ئەو کردەوە و چالاکییەیە کە لە ڕێگەیەوە زانست و لێزانی و لێهاتوویی و، چۆنێتیی هەڵسوکەوت و ئاکاری شیاو فێری تاك دەکات. ئامانجی، بەکۆمەڵایەتیکردنی تاکە. پەروەردە هەوڵ دەدات بۆ دەستەبەرکردنی تاك و جیاوازییەکانی و پێگەیاندنی هاوولاتیی چاکەخواز، پێگەیاندنی مرۆڤ لە ڕووی ئاوەز و جەستە و دەروونی و سۆزداری و ئاکارییەوە، بە پابەندکردنی بە چەندین فاکتەری کۆمەڵایەتی، نەتەوەیی، ئایینی، ئابووری، سیاسی و زانستییەوە. بەمەیش تاك بۆ ژیانی ناو کۆمەڵگە ئامادە دەکرێت. هەروەها ئەرکی سەرەکیی پەروەردە، گواستنەوەی مۆرکی هەڵسوکەوتەکانە لە کۆمەڵگەوە بۆ تاك و، گونجاندنی تاکیش لەگەڵ ژینگەی کۆمەڵگەدا. لێرەیشەوە تاکێکی نۆرماڵی کۆمەڵایەتیی لێ هەڵدەکەوێت، کە ڕێز لە ژیان و مرۆڤایەتی دەگرێت.

بەکورتی، دەکرێت بڵێین پەروەردە بە مانا فروانەکەی بریتییە لە هەموو هەنگاوەکانی کاری چاکە و باشە و، سوودگەیاندن بە دەوروبەر و ژینگە و کۆمەڵگە، دروستکردنی نەوەیەکی تەندروست و قازانجبەخش، گەلاڵەکردنی هەموو هەست و بیرێکی باش و بڵاوکردنەوەی بەسەر تەواوی تاکەکاندا.

## ئایا پەروەردە و فێرکردن دە بێتە هۆکار بۆ دەرکەوتنی توانا و بە هرەکان.؟

یە کێک لە خاوەن بیروڕاکانی سە ردە می کۆن لە سە ر ئەو باوەرەیە کە مرۆڤ خاوەنی زۆر بە هرە و سە لیقە و توانای شاراوە یە کە هە ریە کێکیان لە خۆیدا لایە ن و ئامانجی تایبەتی هە یە، لە کات و قوناغی گە شە و فێرکاری و ڕاهێناندا هیدی هیدی دینە بوون و پەرەدەستێنن و لە تواناوە دە بنە کردە وە. هە ر بە هرە و توانایە ک ئە گەر بە دروستی پە روەردە بکرێت، دە گاتە ئەو پەڕی پێگە یشتن و گە یشتن بە ئامانجی خۆی. پە روەردەی دروست کاتێک جێ دە گرێت کە تواناکان دوور لە کاریگە ری ژینگە، بگەنە مەبەست و وزە سروشتییە کانی مروڤ دوربخەن. چونکە پەرە سەندن و هاتنە کایەی (ئامادە کارییە کان) بە ئاسانی دە رناکە وێت، لە م ڕووەوە (مورە بیان) ڕاهێنەران دە بنە ئامرازی گفتوگۆ و بیرورا گۆرینەوە، هێنان و روو خستنی گرفتەکان و وێنە و نموونەی تایبەت بۆ ئاسانکاری.

ئە مرۆ ڕاهێنەران لە پەروەردەکردنی مندالان و لاواندا کاریگە ری زۆریان هەیە و پێش هە موو شت خودی ڕاهێنەر دەبی لە هە موو روویە کە وە ئامادە بێت بۆئە وەی بتوانێت نەوەیەکی چاک پەروەردە و ئامادە بکات و توانا و هێز و بیر و هزریان بە باشی بناسێت و دەربخات.

## ئایا پەروەردە و ڕاهێنان لە وزەی هۆشە وەیە؟

لە پال بیروبۆچوونی سە لماندنی توانا و بە هرەکان، بۆچوونیتر هەن ناوی لێبنێین ڕاهێنانی هێزی هوشی. (بیرورایەک لەسەر کە دە بێ ئە وە یە کە بە هرەکان لە خۆوەدەردەکەون خۆ تێوەردانی دونیای دەرەکی کەم دەبێتە وە بەلام بۆچوونیتر دەلی: کە مرۆڤ خاوەنی چە ندین هێزی هوشییە ئە و وزانە لە خۆیانە وە کاریگەرییان نییە و دە بێ لە رێگای پەیوەندی و تێکەلی لەگەل دونیای دەرەوە فێربکرێن و ئامادە بکرێن، دەنا هیچ بە رهە مێک لە و وزانە نابینرێت و دە رناچێت.)

بو نموونه: فه یله سووفی به ریتانی - لاک- که لایه نگری ئه م بیرمیه. دەڵێ: زانستی مروف له به رهەمی تێکه لاوی مروف و دونیای دەرە وەیە. - مه یدانی دونیای ده ره کی هێزی جوراوجۆری زەین، وه ک: تێگه یشتن - بینین- سه رنج- پاراستن - پێوانه - تێکدان- پەیوەندی ئه خاته کارەوە، به هۆی کاریگەری ئەوانەوە کار ده کاته سه ر هەستی زانست.)

به م شێوەیه ئه گه ر فاکتەرە دەرە کییه کان هیزی زەین نه خەنه کاره وه و پالی پێوه نه نێن بۆ راهێنان، لێکۆلینەوەکان کارامه و زانستییانه نابێت. هەر وەک، وەرزشکارێک گەر جه سته و ماسولکه کانی خۆی نه خاته کاره وه و به رده وام کاری پێنه کات و رایان نه هینێت، له وەرزش و له کارەکانی سه رکه وتوو نابێت. هێزی زەینیش به بێ راهێنانی شایسته له ئه ستوی کارەکەی دەرنایەت. که وایه کاری فێرکردن و پەروەرده کردنه و به هۆی پەروەردەکردنی شایان هێزی زەین گه شەدەکات. مروف و هۆشی مرۆڤ له خووه ناتوانێت گورانکاری پێک بهێنێت گه ر شوێن و ژینگه و سروشت و فاکته ره کانی ده ورو‌بەری گونجاو و له بار و سازێنەر نه بن. هه روه ها به رفراوانکردن و گه شه پێدانی هۆش و زانستی فیکری و توانا و هێزی مرۆڤ به رده وام پێویستی به راهێنان و فێرکاری و په یوه ندی به رده وامی دونیای ده ره کی و ناوه کی مرۆڤ هەیه، تا بتوانێت به ئامانجه کانی بگات. فێرکاران ده بی ئه وه نده هۆشیار بن که بتوانن قوناغه کانی ته مەن بناسن و هه ر به شێک ئه رکی خۆی پێ بسپێرن.

## ئامانجەکانی فەلسەفەی پەروەردە

دیاریکردنی ئامانجه پەروەردەییەکان کارێکی گەورە و گرانە، چونکه ئامانجەکانی پەروەردە گشتی و گشتگیرن و ڕوون و نەمرن و درەنگ گۆڕانیان بەسەردا دێت. ئامانجەکان هەم پێوەر و هەم چارەنووسی پرۆسەی پەروەردە دیاری دەکەن. لێرەدا چەند ئامانجێکی گرنکی فەلسەفەی پەروەردە دیاری دەکەین، وەکوو:

1. بەرەوپێشبردن و پاراستنی کەلتووری کۆمەڵگە و، گواستنەوەی ئەو داب و نەریتە باش و کەلتوورە بەپێز و مەعریفە قووڵە بۆ نەوەکانی داهاتوو.
2. نەهێشتنی نەخوێندەواری و بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیریی تاکەکانی کۆمەڵگە.
3. کارکردن بۆ بەهێزکردن و پەرەسەندنی کەسایەتیی تاك و کارلێککردنی لەگەڵ کۆمەڵگەدا.
4. پەرەسەندنی گیانی نیشتمانی و ئامادەکردنی تاکێکی دڵسۆز بۆ خاك و نیشتمان.
5. پەروەردەکردنی تاك لەسەر بنەمای ئازادی و یەکسانی و ڕێزگرتن لە یاسا و دامەزراوەکانی دەوڵەت.
6. پێکهێنان و بەخشینی تاکی خاوەن وزە و لێهاتوو و پسپۆڕ بە کۆمەڵگە.
7. بەهێزکردنی گیانی کرانەوە و تێکەڵاوبوون و یارمەتی و هاوکاری لەسەر ئاستی نەتەوە و مرۆڤایەتی.
8. بەخشینی توانای بیرکردنەوە و هۆشیاری و هەڵسەنگاندن بە تاك.
9. هاندان و دروستکردنی دەرفەت بۆ تاکی کۆمەڵگە بۆ گەیشتن بە مەعریفەیەکی دروست.
10. کەواتە فەلسەفەی سیستەمی پەروەردە و فێرکردن، دروستکردنی نەوەیەکی هۆشیار و پڕزانست و زانیاری و، پێگەیاندنی گەنجێکی چاونەترس و نیشتمانپەروەرە و، هێنانەکایەی کەلتوورێکی مۆدێرن و، دوورخستنەوەی کۆمەڵگەیە لە هەموو جەهل و نەزانی و تاریکییەك.

## بیروڕای "ئه فلاتوون لەسەر پەروەردە:

- لیرەشدا باسی بیرورای فەیلە سووفی بە ناو بانگ "ئە فلاتوون" دەکە ین یەکەمین زانایە پیویستی پە روەدە و فیرکردنی بە دەس هیناوە و بە جوانی باسی کردووە. دەڵێ: ئە گە ر ئە ندامانی کۆمەڵ بە گوێرەی توانا ئامادەکاری خویان، کاریان پێ بسپێردرێ، هەر کام دەتوانێت بە رادیۆکی زۆر بە رز، بۆ کۆمە لگا سوودبە خش بێت... بەم پێیە کۆمەلگا ناتوانێت بە بێ فێرکردن و پەروەردە کردنێکی دروست، بەردەوام و راوە ستاو بێت.

کە سێک دە توانێت بە خۆشی ژیان بکات کە لە رادە و بنج و بنەوانی کارە کانی هوشیار بێت و مە بە ست و ئامانجی کارەکەی بناسێت. ئە و کە جۆرە کەسانە دەبی زمینی کاملیان هە بێت، ئە وەش تە نیا لە کومە لگای رێکوپێک و هاوکار و یەکگرتوو بەدی دێت و جێ دە گرێت. ئەگەر کۆمەلگا لە هاریکاری و یە کبوون بێبە ش بێت، زمینی ئە ندامانیشی هەروا پە رێشان و شێواو دە بێت، چونکە هە ر کۆمە لگایەک بە پێی رەسم و داب و نە ریت و یاساکانی خۆی، هە ولی پە روە ردە کردنی ئەندامانی ئەدات، و رێگا و ریبازی خۆی بە سەریاندا دەسە پێنێ. بۆیە گەر بمانە وێ ژیانی خۆش و ئاسایشمان هە بێت، دەبی بە فیرکاری و راهێنانی دروست و لە بار، زمینە کانمان روونا‌ك بکە ینە وە. پە روەردە و راهێنانی دروست و زانستانە، تە نیا لە کۆمەلگای سالم و هاوئاهە نگدا دە ست دە دات و دێتە کایەوە. واتە دە بێ پێشدا کۆمەلگای شایان و تێکوشەر بە دە ست بینین و پاشان بیر لە پە روەردە و فرکردن بکە ینە وە.

زۆربەی فە یلە سووف و زاناکان لە م بوارەدا، واتە بواری پەروەردە و فێرکردن، بۆچون و بیری جیاوازو تەنانەت دژ بە یە کیان هە یە، بە لام من لێرە زیاتر ئەو بۆ چوونانەی کە نزیک و لێک دەچن باس دەکەم.

- ئە فلاتوون" بۆ بناغەی کومە لگای ریکوپێک، پێشنیار ئەکات کە: دە سە لاتی بە رێوەبەری کومە لگا دە بی بە فە یلە سووفان بسپێردرین تا بە بیر و بوچوونی خویان رێگا و رێبازی خە لک بدۆزنەوە و بە دە ستە و کومە ل و،بە پێی ویستی خۆیان، بیانخە نە نێو کارەوە و یەکێتی و یە کرێزی کۆمەلگا بپارێزن. هە رچە ندە لە وانە یە ئەم فکرە لە سە ردەم و چاخی ئە فلاتوون و دواتریش دروست بووبێت، کە ئە و هاتووە قالب و چوارچێوەی بۆ تاک، دیاری کردووە و کۆمەلگای بە خاوە نی سێ چینی جیاواز و نە گور زانیوە.

- چینی رە نجبار- چینی پاریزەر- چینی فە رمانرەوا. گوایە کارە سە خت و مە یدانییەکانی کۆمە لگا لە ئە ستۆی توێژی رە نجبە ر و دیل و بە ندی ئارەزوو و هەوەسە، لە هۆش دوورە، بە و پێیە! توێژی پارێزەر، هە ندێک خاوەن هۆشە و بە پێی پلە و پایە، کۆمەلگا دەپارێزێت. چینی فە رمانڕەوا تە واوی هوشە (عە قلی کول) و سە روەری کومەلگا دەکات!.

گە رچی بنە مای فە لسە فەی پەروەردەی ئە فلاتوون لە روانگەی ئێمەوە دروستە، بە لام بە بۆچوونی "(دەیوی )ناتوانین ئە نجامەکانی ئە و بیر و بوچوونانەی کە دایناون قە بوول بکە ین. هە روە ها دەڵێت: ئیمە ناتوانین ئە وە قە بوول کەین کە هە ر تاکێک بە تە واوی بە ندی چینێکە و دە بێ وابێت!. "

جان دیوید" کە بوچوونە کەی جیاوازە، باوەڕی وایە کە، چە مکی هەر تاکێک بۆ گە شە کردن بە رفراوانە و ئە توانێت بە هۆی گۆرانکاری لە پە روەردە و فێرکردندا، ئارنگ ئارنگ کۆمە لگا بگۆرێت. فەلسەفەی تە ربییە تی ئە فلاتوون، فە لسە فە یە کی بزوتنەوەیی و شۆرشییە بەلام چونکە لە یەک بازنە دا دەوران دە خوات ئە نجامی تە واوی نییە.

# مێژووی پەروەردە

پەروەردە پرۆسەیەکی تەمەندرێژ و دێرینە؛ هاوتایە لەگەڵ بوونی مرۆڤدا. لە بەرەبەری مێژوودا پەروەردە بەم شێوەی ئێستا ڕێکخراو و ڕێکوپێك نەبووە؛ پرۆسەیەکی نافەرمی بووە و، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە لایەن خێزانەوە ئاراستە کراوە و، لە ڕێگەی ئەزموون و لاساییکردنەوە بووە. خێزانیش ڕێگە و شێوازی تایبەتی خۆی لە پەروەردەکردندا جێبەجێ کردووە و بەپێی ئاستی تێگەشتن و دونیابینیی خۆی پەروەردەی منداڵی کردووە. ئامرازەکانی فێربوون بریتی بوون لە: نەریتەکان، سیستەمی بەهاکان، هونەرەکانی بەرهەمهێنان وەکوو ڕاوکردن، کشتوکاڵ، چنین و هتد.

لە شارستانییەتەکانی "بابل" و "میسری دێرین"دا بایەخ بە فێربوونی ئایینی و هونەری و پەیکەرتاشی و تەلارسازی و فێربوونی نووسین و خوێندنی سەرەتایی دراوە. لە شارستانییەتەکانی "هیندی" و "چینی"یشدا گرنگی بە لایەنی مەعریفی و ڕەفتاری تاك دراوە، بەتایبەتی چینی ئەرستۆکراتەکان.

لە سەردەمی "یۆنانی کۆن"دا پەروەردە زیاتر پێش کەوت کە پەروەردەی ئایینی و فەلسەفی و سیاسی و سەربازی و فێرکردن و ڕاهێنانی "وتاردان" لەخۆ دەگرێت. لە تێڕوانینی ئەفلاتۆندا پەروەردە و فێرکردن خاوەنی چەندین تایبەتمەندیی تایبەتی دیاریکراون. ئەفلاتۆن لە وتوێژی کتێبی "کۆمار"دا سیستەمی فێرکردنی لە سێ قۆناغدا چارەسەر کردووە: یەکەمیان هاوشانی قۆناغی فێرکردنی سەرەتاییە لە چەرخی هاوچەرخدا. بنەماکانی ئەم قۆناغە ڕاهێنانی جەستە و موزیکە؛ واتە گەشەکردنی لاشە و گیان (ڕۆح)، لە کاتێکدا ئەم دووانە لەبارییاندایە پێك بێن. ئەفلاتۆن پێی وایە ئەوەی شایەنی بەڕێوبردنی منداڵە تاکوو ببێتە پێشەنگی منداڵ، ئەو کەسە نییە کە فێری ئەفسانەی بکات، بەڵکوو ئەوەیە کە توانای هەیە خۆشویستنی جوانی تێدا بچێنێت و لەگەڵیدا بسازێ. بیرۆکەی سازاندن (پێکهاتن) شوێنێکی تایبەتی لە کتێبی کۆماری ئەفلاتۆندا گرتووە. سازاندن و گونجاندن لە نێوان چینەکاندا بەدەستهێنانی دادپەروەرییە لەسەر ئاستی دەوڵەت. گونجاندن لە نێوان بەشەکانی جەستە، بەختەوەریی تاکە. مادام تاك لە فێرکردندا مەبەستە، ئەوا گونجاندن لە خۆیدا بەندە لەسەر میکانیزمێکی دیاریکراو، کە فێربوونی موزیك و پەروەردەکردنی جەستە، بناغەکەیەتی.

لە شارستانییەتی ئیسلامیدا پەروەردە ڕەهەندێکی تەواو ئایینی وەردەگرێت؛ لە مزگەوت و حوجرەدا جێبەجێ دەکرێت و زانستە شەرعییەکانی ئیسلام و ئاکار و ڕەفتاری ئیسلامی فێری تاك و کۆمەڵگەیش دەکرێت. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا پیاوانی ئایینی و کەنیسە کۆنترۆڵی کۆمەڵگە دەکەن و، پرۆسەی پەروەردە بۆ چەسپاندنی بنەماکانی ئایینی مەسیحی و بەهێزکردنی دەسەڵاتی کەنیسە جێبەجێ دەکەن.

لە دوای شۆڕشی ڕۆشنگەری و پیشەسازی، ڕۆژاوا بایەخ و گرنگیی زۆری بە پەروەردە داوە. ئەوان توانییان سوود لە زانست و مەعریفە و فەلسەفەی شارستانییەتەکانی یۆنان و ئیسلامی وەربگرن. لێرە بەدواوە پەروەردە شێواز و میکانیزمی نوێی وەرگرت و پەروەردەی نەریتی و کۆن بایەخی خۆی لەدەست دا. دامەزراوەی پەروەردە و فێرکردن دامەزران و، چوارچێوەی کارگێری و ڕێکخستنی کارگێری و هونەری بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبردن و ئاراستەکردنی پەروەردە هاتنە دامەزراندن.

لە دونیای هاوچەخدا پەروەردە بەرپرسە و ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕێت لەو شۆڕشە زانستی و تەکنەلۆژییەی بەرپایە و، جیهانی هاوچەرخ پەرورده و ئاراستە دەکات کە لەگەڵ ئامانج و خواستەکانی کۆمەڵگەدا بگونجێت.

لە پەروەردەی کۆن یان چەند دەیەیەك پێشتر، پەروەردە تەنیا کاری ناو قوتابخانە بووە و، هەندێ جاریش تەنیا پرۆسەی فێربوون بووە؛ بەڵام پەروەردە زیاتر لەوە دەگەیەنێت و گرنگییەکی ژیانی هەیە بۆ کۆمەڵگە و تاك، بۆ مانەوەی کۆمەڵگە و گەشەی تاك. بەڵام لە پەروەردەی هاوچەرخدا پەروەردە وەك سامانێکی گشتی تەماشا دەکرێت و کارێکی بەکۆمەڵی کۆمەڵگەیە؛ دەزگە کۆمەڵایەتییەکانی تریش بەشدار دەبن و ڕۆڵیان تیایدا دەبێت. پەروەردە، بووە بە یەکێ لە پێداویستییە سەرەکییەکانی ژیانی هاوچەرخ؛ پەروەردە، بووە بە بەرپرسیارێتی و ئەرك و پرۆژەی دەوڵەتەکان. فەلسەفەیەکی پەروەردەیی لە پشت پرۆژەی پەروەردەوە بەرقەرارە و تیۆریزەی بیردۆزی پەروەردەیی دەکات و ئامانج و مەبەستە دوورەکانی دیاری دەکات و چارەی کێشە و ئاریشە و ڕێگرییەکانی پەروەردە دەکات.

## کۆتایی

پەروەردە پرۆسەیەکی بەردەوامی مرۆڤایەتییە و، هاوکاتە لەگەڵ بوونی مرۆڤ. لە کۆمەڵگە بەراییەکانەوە تا دونیای هاوچەرخ، پەروەردە خەم و هیوای مرۆڤەکان بووە بۆ بەردەوامیی ژیان و شارستانییەتییەکان. لە هەموو قۆناغە مێژووییەکاندا مرۆڤ هەوڵی بەجێگەیاندنی پەروەردەکردنی نەوەکانی داوە. هەر کۆمەڵگەیەك بە شێوازی پەروەردەی پەسەند و دڵخوازی خۆی پەروەردەی بەئەنجام گەیاندووە. زۆر بیرمەند و نووسەرانی دونیا قسەوباس و لێکۆڵینەوەیان لە پەروەردە کردووە، تیۆریزەی چەندین بیر و تیۆرییان کردووە بۆ ڕێکخستنی پرۆسەی پەروەردەیەکی تەندروست و، چەندین ئامانجی خێرا و دوورمەودا بۆ ئاسوودەیی و پێشکەوتن و هۆشیاریی تاك و کۆمەڵگە، دیاری کراوە.

کۆمەڵگەی ئێمە _کۆمەڵگەی کوردی_ پێویستی بەو بۆچوونە فەلسەفییانەیە کە لە ناخی کۆمەڵگەکەمانەوە هەڵقوڵابێت؛ بەو بۆچوونە بوێرانەیە کە دەرمانی دەردەکانمان بکات و کێشەکانمان چارەسەر بکات، وەك چۆن لە هەمان کاتدا پێویستمان بە سیستەمێکی پەروەردە و پرۆگرامێکی فێرکردن هەیە، کە لە توانایدا بێت لە بواری پراکتیکدا بۆچوونە فەلسەفییە دروست و بەسوودەکان جێبەجێ بکات.

## سەرچاوەکان


- مێژووی پەروەردەو فێرکردن/عەلی ئەکبەر میهرتارا/٢٠١٠.
- پەروەردەو فێرکردن/ شامل زازا /٢٠٢٠.
- باسێک لە بنەمایی پەروەردەو فێرکردن و گۆمەلگایی پێشکەوتوو /مجید کاکەویس.
- پەروەردەی پێشکەوتوو/عدنان کەریم /٢٠١٧